زنجیرەی
زانستی جەستە
9

# دەمارە کۆئەندام و مێشك





# دەمارە کۆئەندام و مێشک

9

نووسینی: ئیسماعیل حەکیم ئۆغڵو


دەزگای بەرهەمهێن: بڵاوکراوەکانی تیماش

وەرگێڕانی: دۆستی عوسمان صدیق

پێداچوونەوەی: ئەڤین صدیق ، دڵسۆز عەلی

نۆبەی چاپ: یەکەم - ٢٠٢٠



ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA MEDIA CENTER

053 323 1843 | +964 (0) 770 358 7100

www.aramediacenter.com

info@aramediacenter.com

AraMediaCenter



# ناوەڕۆک





# پێویستییەکی لەبیرنەکراوی ژیانمان: کارەبا

با بۆ ساتێك بیربکەینەوە ئەگەر لە ژیانماندا کارەبا نەبووایە چی دەبوو؟

لەبەر ئەوەی بەرزکەرەوەکان کاریاننەدەکرد، دەبوو لە باڵەخانە بەرزەکاندا پشت بە پلیکانەکان ببەستین.

نەماندەتوانی کار بە کۆمپیوتەرەکانمان بکەین و، لە ئینتەرنێتدا لێکۆڵینەوە بکەین. کاتێك بارگەی مۆبایل و تابلێتەکانمان تەواودەبوو نەماندەتوانی بارگاوییانبکەینەوە.

نەماندەتوانی لە تەلەڤزیۆندا تەماشای کارتۆن بکەین، یاخود یارییەکانی شاری یاری بکەین.

زستانان نەماندەتوانی لەپاڵ هیتەرێکدا خۆمان گەرمبکەینەوە، یاخود پاش خۆشووشتنمان قژمان وشکبکەینەوە.



# ئەو شتانەی لە شارێکی بێ کارەبادا ڕووبەڕوومان دەبنەوە!

تەنها چەند زانیارییەك سەبارەت بەو ڕووداوانەی لە شارێکی بێ کارەبادا چاوەڕێمان دەکەن! لە ئەگەری نەبوونی کارەبادا هەموو ئەو ئامرازانەی لە شارەکەدا پەیوەستن بە کارەباوە، میترۆکان، گڵۆپەکانی هاتووچۆ، سیستەمەکانی ڕووناکی و پەیوەندی ناو شار، ڕێکخراویی شوێنکارەکان، بەکورتی هەموو ئەو شتانەی پەیوەستن بە ژیانمانەوە دەوەستان. کارەباپڕانێکی درێژخایەن کە نەخۆشخانەکانیش بگرێتەوە ژیانی هاوڵاتیان دەخاتە مەترسییەوە و، شەوانی شارێکی بێ ڕۆشنایی زۆر ترسناك دەبوو. بیربکەنەوە کە ئوتومبیلەکانی فریاکەوتن لە نیوەی ڕێدا بمێننەوە و نەگەنە نەخۆشخانەکان. بیهێننە پێش چاوتان کە دەمەوئێوارە کە خەڵکی لەسەر کارەکانیان دەگەڕێنەوە و، ئێوەی خوێندکاریش ڕێی ماڵەوەتان گرتووەتە بەر لەناکاو تەواوی ڕووناکییەکانی شار بکوژێنەوە. ئەو ئاڵۆزییەی دەکەوێتەوە بەڕاستی زۆر گەورە دەبێت.

وەك
دەبینن گوزەران
لەگەڵ نەبوونی کارەبا
لە ژیانی ڕۆژانەماندا بۆ ئێمە
یەکجار زۆر سەخت دەبوو.
ئێستاش با بیر لە چۆنیەتی
ژیانی شارێکی بێ کارەبا
بکەینەوە.

# سیستمی کارەبایی جەستەمان

ئایا دەزانن کە جەستەتان، هەروەکو کۆمپیوتەر بە کارەبا کاردەکات؟ ئەم کارەبایە، کەمێك لەو کارەبایە جیاوازترە کە لەگەڵ پێوەکردنی پلاکدا ئامێرەکان دادەگیرسێنێت!

ئەگەر کارەبا نەبێت، ئەوا ژیانی هاوچەرخی ئەمڕۆی شارەکان چەقدەگرێت. هەروەك چۆن کارەبا بۆ هەڵکردنی تەلەڤزیۆن و، بەکارهێنانی گسکی کارەبایی پێویستە، بەهەمان شێوەش کارەبا بۆ بەرهەمهێنانی وزە و پەیوەندییەستن و، پاراستنی جەستەشمان پێویستە.



زۆر چالاکی جەستەمان وەك سووڕی خوێن و، ڕاپەڕاندنی بەرپرسیارێتی ئەندامەکان بەبێ کەموکورتی و، لێدانی دڵمان بەبێ هیچ چەشنە کێشەیەك و، کارکردنی مێشکمان پەیوەستە بە کارەباوە. ئیدی لەبەر ئەمەیە کە کارەبا بۆ جەستەی مرۆڤ گرنگییەکی لەڕادەبەدەری هەیە.



پێویستی جەستەمان بە کارەبا، زۆر لە پێویستی شارێك گرنگترە. چونکە تێچووی ئەو زیانانەی بەهۆی کارەبابڕانەوە بەر شارێك دەکەوێت هەر چەندێك بێت قەرەبوو دەکرێتەوە. بەڵام قەرەبووکردنەوەی بڕانی کارەبای جەستەمان شتێکی مەحاڵە.

# سیستمێکی ئاڵۆز و ژیر

دەتوانیـــن سیســـتمی کارەبایـــی جەســـتەمان بـــە تۆڕێکـــی کارەبا بچوێنین. جەســـتەی مرۆڤ خاوەنی سیســـتمێکە تەنانەت لە باشترین تۆڕی کارەباش زۆر باڵاترە. جەســـتەمان زۆر باش دەزانێت چۆن ســـوود لـــە وزەی کارەبا ببینێـــت. خاوەنی چەندیـــن ئامێرە، کە هـــەر یەکێکیان لەوی دیکەیـــان لێهاتووترە.

ئەو ئامێرە کارەباییانەی لەمرۆکەماندا بەکاردەهێنرێت لەم ســـەدەیەی کۆتاییـــدا دۆزراونەتـــەوە. بەڵام سیســـتمەکانی جەســـتەی مـــرۆڤ، لە یەکـــەم ڕۆژی مرۆڤایەتییـــەوە بەم شـــێوە ناوازەییەیان هەبوون.



# کارەبا چییە؟

**بە بچووکترین پێکهاتەی سروشت دەوترێت گەردیلە.**

گەردیلــە ناوکێکی هەیە و، چەنــد پارچەیەکیش هەن کــە بەدەوری ناوکەکــەدا دەســووڕێنەوە. ئــەم ناوکە لــە «پرۆتــۆن» و «نیوترۆن» پێکدێــت. بــەو پارچانەشــی بــە دەوری ناوکەکــەدا دەســووڕێنەوە دەوترێــت «ئەلیکترۆن».

ئەلیکترۆنــەکان بەبەردەوامی دەســووڕێنەوە، واتە لــە جووڵەدان. پرۆتۆنەکان بارگــەی کارەبایــی موجــەب و، ئەلیکترۆنەکانیش بارگەی کارەبایی ســالبیان هەیە. ئەو هێمای (+) و (-)ەی لەســەر پیلی کۆنترۆلی تەلەفیزیۆنەکانتــان دەیبینن هێمای ئەم بارگــە کارەباییەن.

لەباری ئاســاییدا ژمارەی پرۆتۆنــەکان و ئەلیکترۆنەکانی گەردیلەیەك وەك یەکــن. بەم بــارەی ئەتۆم دەوترێــت «هاوکێش». بــە تێکچوونی ئەم هاوســەنگییەی گەردیلە تەزووی ئەلیکترۆنی دەســتپێدەکات. لەم بارەدا دەشــێت گەردەکە ئەلیکترۆنێك وەربگرێت یاخــود ئەلیکترۆنێك لەدەســتبدات. بەمشــێوەیە تەزووی ئەلیکترۆنی دروســتدەبێت. ئیدی ئەو هێــزەی پێــی دەوترێت تــەزووی ئەلیکترۆنــی و تەلەڤزیــۆن و کۆمپیوتەر و گڵۆپەکانی ســەر شەقامەکان کارپێــدەکات «کارەبا»یە.



# وزەی کارەبا بۆ جەستەمان چەندێك پێویستە؟

جەستەی مرۆڤ بەبێ بوونی کارەبا کارناکات. ئێوە کاتێك خەریکی گوزەرانی خۆتانن، کاتێك دەچن بۆ خوێندنگە، یاخود کاتێك لەگەڵ هاوڕێیەکتاندا قسە دەکەن وزەی کارەبا گرنگییەکی لەڕادەبەردی هەیە بۆتان. ئەگەر کەموکورتییەك لە وزەی کارەبای جەستەدا ڕووبدات دەشێت مرۆڤ ئیفلیج ببێت. بەکورتی «ئەگەر کارەبا نەبێت تەواوی زیندەچالاکییەکانمان دەوەستن.» چونکە لەیەکەم ساتەوەختی هاتنە دنیامانەوە بە کارەباوە پەیوەست بووین و ژینگەکەشمان هەر بەمشێوەیە ناسیوە. بەهۆی ئەمەوەیە دەتوانین پێنج هەستەوەرەکەمان بەکاربهێنین، بجوولێین، قسەبکەین.

(ئەگەر نەخۆشێك لێدانی دڵی تێکبچێت و لە لێواری مەرگدابێت، سەرەتا کارەبای لێدەدرێت. بۆچی ئەم نەخۆشە دەرمان، ڤیتامین، یاخود خۆراکی پێنادرێت و کارەبای لێدەدرێت؟



چونکە سەرەڕای ئەوەی هەموو ئەم شتانە سوودیان بۆ جەستە هەیە، بەڵام کارکردنی دڵ سەرەتا پێویستی بە کارەبایە. ئەگەر کارەبایی جەستە بە هەر هۆکارێك تێکبچێت، ئەوا هیچ شتێك ناتوانێت شوێنی ئەو کارەبایە بگرێتەوە.

# ڕێکخراویی کارەبایی دڵمان

کاتێك یاری باسکە لەگەڵ هاوڕێکانتاندا دەکەن، لەگەڵ هەر جووڵەیەکتاندا بۆ وەرگرتنی تۆپەکە چەند دانەیەك لە ماسوولکەکانتان دەخەنە جووڵە. کاتێك ماسولکەیەکتان جووڵەیەك دەکات بە تاڵکردنەوەی بارگەی کارەبایی ڕوودەدات. ئەو فەرمانانەی لە مێشکەوە دەردەچن، لەڕێی ڕاگەیاندنی کارەباییەوە دەگوازرێنەوە.

لێدانی بەردەوام و بێوچانی دڵ، کە یەکێکە لە گرنگترین ئەندامەکانی جەستە، ڕووداوێکی کارەباییە. هەمان بارودۆخ لە ئەندامەکانی دیکەشدا هەیە. لە جەستەماندا بارودۆخێك نییە پەیوەندی بە کارەباوە نەبێت. کاتێك ئێوە لە جێخەوەکەتاندا ڕادەکشێن تا پشووبدەن، دڵتان لە لێدان ناکەوێت و، سییەکانیشتان بەردەوامن لە هەڵمژینی ئۆکسجین. بەبێ ئەوەی ئاگاداربن چالاکییە کارەباییەکانی جەستەتان بەردەوام دەبن.



"زۆر سوودی سیستمی کارەبایی جەستەمان دەبینین، جا درکی پێبکەین یان نا. بۆ نموونە، کاتێك پەنجەیەکتان دەبڕن پاش ماوەیەك کەم جێی برینەکە سارێژدەبێتەوە. لە پشت ئەم سارێژبوونەوەیەشدا سیستمی کارەبایی جەستەمان هەیە."



تواناکانی ئەو بەرزکەرەوانەی لە باڵەخانەکاندا ئاسانکاریمان بۆ دەکەن و، ئەو کۆمپیوتەرەی وانەی لەسەر دەخوێنین و یاری پێدەکەین و، ئەو ئوتومبیلانەی یاری کە لە شاری یاریدان و، هەزاران ئامێری کارەبای دیکەش بەچەند شتێکەوە سنووردارە. بۆ نموونە، بەرزکەرەوە تەنها بۆ گواستنەوە دروستکراوە. بەڵام ئەو وزەی کارەباییەی جەستەمان بەکاریدەهێنێت چەندین کۆئەندامی یەك لە یەك جوداتر دەخاتە کار.

جگە لەوەش ئامێرە کارەباییەکان وزەیەکی زۆر بەکاردەبەن. بەڵام بڕی ئەو کارەبایەی جەستەمان بەکاریدەهێنێت زۆر کەمە.

تەواوی چالاکییەکانی جەستەمان بەهۆی سیستمی کارەباوە کاردەکات. سووڕی خوێنی جەستە، پارێزگاریکردنی کۆئەندامی بەرگری لە جەستەتان لەبەرامبەر مەترسی بەکتریا و ڤایرۆسەکاندا، کارکردنی کۆئەندامی هەرس و، چەندەها چالاکی دیکەی وەك ئەمانە بەهۆی کارکردنی ڕێکخراوی سیستمی کارەباوە دێنە ئاراوە.



# بەکارهێنانی بەردەوامی کارەبا

بەکارهێنانـــی کارەبای جەســـتەی مرۆڤ وەســـتانی بۆ نییـــە. ئەگەر جەســـتەی مرۆڤ بـــە ئامێرێکی کارەبایـــی بەراوردبکەیـــن، دەبینین کە ئامێرێکـــی کارەبایی بەگشـــتی ١٠-١٥ ســـاڵ تەمەنیەتـــی. تەنانەت زۆر کات پێویســـتە بەر لەم وادەیـــە نۆژەنبکرێتـــەوە. تێکدەچێت و، دەبێت پارچەکانی نوێبکرێنەوە. بەڵام جەســـتەی مرۆڤ، لـــە هەندێ بارودۆخدا نەبێت، بەدرێژایی تەمەنـــی بەبێ وەســـتان کاردەکات. دڵتان تا کۆتایی تەمەنتـــان بەبـــێ وچـــان کاردەکات، ئیدی ئێـــوە خەوتـــبن، بەخەربن، خەریکی هـــەر کارێك بن ئـــەو لە لێـــدان ناکەوێت.



تەواوی ئامێرەکانی سەرزەوی،
ئیدی هەرچەندێك پێشکەوتووش
بن، تەمەنێکی دیاریکراویان هەیە و،
ماوەیەکی دیاریکراوی کارکردنیان هەیە. کارگەکان ناچارن
بەبەردەوامی چاودێری دامەزراوە تەکنەلۆجییە گەورەکان
بکەن و، پارچە کۆن و شکاوەکانیان چاکبکەنەوە و،
بەردەوام لەژێر چاودێرییاندا بیانهێڵنەوە.



# ڕێگەیەکی جێی متمانەی کارەبا: دەمارە کۆئەندام

ناوەنـدە کۆئەندامـی دەماریـی مـرۆڤ، یەکێکـە لـە ئاڵۆزترین و ناوازەتریـن پێکهاتەکان. تۆڕی شـەقامەکانی شـارێکی گـەورە بهێننە پێش چاوتان. شەقامە سـەرەکییە پانەکان، ڕێگا لاوەکییەکان، پردەکان و، تێکهەڵکێشـەکانی نێوان ڕێگاکان... پەیوەندی نێوان شـەقامەکان و، خاڵی بەیـەك گەیشـتن و لێکجیابوونەوەیان خۆی بۆخـۆی زۆر ئاڵۆزە، جا ئەگـەر قەرەباڵغییەکی زۆریشـی سـەربخرێت ئـەوا بارودۆخەکە بەیەکجارەکی دژواردەبێت. سەرەڕای گشـت ئەم ئاڵۆزی و جموجوڵەش تەواوی ئەم شـەقامانە خاڵی سـەرەتا و کۆتاییان هەیە. هەمووشـیان بـەرەو ئامانجێـك دەڕۆن. ئیـدی هەروەك ئـەم شـەقامانە، پێکهاتەی سـەرەکی دەمارە کۆئەندامیشـمان لـە ملیۆنەها دەمارەخانـە و تریلیۆنەهـا گەیەنـەری نێوان ئەم خانانـە پێکدێت.



کۆئەندامـی دەماریـمان لـە زیاتـر لە ١٠٠ مليـار خانە پێکدێـت. بـەم خانانـە دەوترێـت «دەمارەخانـە». ئەگـەر ئـەم دەمارەخانانـە بـە کێبڵ بچوێنیـن، ئەوا جەسـتەی مـرۆڤ بـە چەندین کێبڵـی ملیۆنەهـا مەتر درێژ، کە پێی دەوترێـت دەمار، دەورەدراوە. ئـەم دەمارانـە بـە هەمـوو جێیەکی جەسـتەماندا بڵاوبوونەتـەوە. زانیـاری و فەرمانـەکان لە ڕێگەی ئـەم دەمارانەوە بـە خانەکان دەگەیەندرێـن. خێرایی گواسـتنەوەی زانیاریـەکان، نزیکـەی خێرایـی دەنـگ دەبێـت. هـەر پەیامێکیش زۆر بـەوردی دەگەیەندرێتە شـوێنی مەبەسـتی خـۆی.

# دەمارەکان پەنجەرەگەلێکن بەڕووی جیهاندا دەکرێنەوە!

هەر زانیارییەکی جەستە لەڕێی دەمارەکانەوە دەگەیەنرێتە شوێنی مەبەست. دەشێت ئەم زانیاریانە پەیوەندییان بە هەر کارێکی ژیانی ڕۆژانەتانەوە هەبێت. ئەم زانیارییە دەشێت بۆنی خواردنێکی خۆش، ئەو هەستەی لە سەرەپەنجەکانتاندا هەستیپێدەکەن کاتێك دەست بە دوگمەکانی تەختەکلیکی کۆمپیوتەرەکەتاندا دەنێن، تامی ئەو ساردییەی دەیخۆنەوە، دەنگی تەلەفۆن یان هەر زانیارێکی دیکەی وەك ئەمانە بێت. هەموو ئەو زانیاریانەی پەیوەستن بە هەست و بیروبۆچوونەکانتانەوە لەناو درێژایی دەمارەکاندا دێن و دەچن. ئەم زانیاریانەش لەناو دەمارەکاندا دەکرێن بە کۆد. گەشتی ڕاگەیاندنە کارەباییەکان بەنێو جەستەدا لە هاتووچۆیەکی قەرەباڵغ و بەردەوام دەچێت. هەروەك ئوتومبیلەکانی سەر شەقامێکی قەرەباڵغ، ئەم ڕاگەیاندنانەش بەبێ وەستان دێن و دەچن. لە ئەنجامی ئەم هاتووچۆیەوە دنیایەکی ڕەنگاوڕەنگ و ڕازاوە دێتە ئاراوە.

# ئەگەر دەمارەکان نەگەنە شوێنێکی جەستەمان...

دەمارەکان بە هەموو شوێنێکی جەستەتاندا بڵاوبوونەتەوە و، هیچ جێیەکیان جێنەهێشتووە. بیهێننە پێش چاوتان ئەگەر کەموکوڕییەك لە کارەکانی ئەم کۆئەندامەدا هەبووایە، یاخود دەمارەکان بە شوێنێکی جەستەتان نەگیشتبان، بۆ نموونە ئەگەر دەمارەکان نەگەیشتبانە قاچی چەپتان چی دەبوو؟

بەر لە هەر شتێك نەتاندەتوانی بەڕێدا بڕۆن. هەستتان بە قاچتان نەدەکرد، ئەگەر قاچتان بەشتێك برینداربکردایە ئاگاتان لێینەدەبوو و، نەتاندەتوانی هیچ کارێك بە قاچتان ئەنجامبدەن.



# دەمارەخانەکان، ڕۆڵی کێبڵی کارەبایی دەبینن

دەمارەخانـەکان لە کێبڵـی کارەبایی دەچن. کێبڵـی کارەبایی تەلێکی مسـین لـە ناویدایە کـە تەوژمـی کارەبـای پێـدا تێدەپەڕێـت و، لە دەرەوەش ماددەکی دابڕێنەری پلاسـتیکی پێوەیـە. دەمارەخانەکانیش ڕیشـاڵی زۆر باریکیـان لەناودایە کە تەوژمی کارەبای پێـدا تێدەپەڕێت. لە دەرەوەش مـاددەی دابڕێنەری پێوەیە کـە وەك بەرگێك ڕۆڵدەبینێت. ئـەم بەرگە، هەروەك بەرگـی کێبڵی کارەبا، ڕێگە لە شـۆرتکردن دەگرێت.

هەر دڕاوییەك لـە کێبڵی کۆمپیوتەرێکدا هەبێت دەبێتە سـەرچاوەی مەترسـی. بەکارهێنانـی کۆمپیوتەرەکەتـان لـەم بارەدا هـەم زیان بە کۆمپیوتەرەکەتـان دەگەیەنێـت هەم مەترسـی پڕیشـکی کارەباش لە ئارادایـە. باشـترین کار لەم کاتـەدا چاککردنـەوەی کێبڵەکەیـە. بەڵام هـەر دڕاوییەك لـە دەمارەخانەی کەسـێکدا هەبێت سـەر بۆ کێشـەی زۆر گەورەتر دەکێشـێت. ئەگـەر ئـەم دڕاوییە بەهۆی ڤایرۆسـێکەوە زیانی بەربکەوێت ئەوا تەواوی کارەبای جەسـتەی کەسـەکە بە هەموو شـانەکانیدا بڵاودەبێتەوە. لە ئەنجامی ئەمەشـدا کەسـەکە یان نیمچە ئیفلیج یـان بەتەواوی ئیفلیـج دەبێت.

# ئەندامە ماسولکەییەکانمان چۆن کاردەکەن؟

تــەواوی لــق و پۆپەکانــی دەمارخانەکانــی جەســتەمان، کە وەك ئامێرێکی ناوازە کاردەکەن، کارەبایان هەڵگرتــووە. هەر کاتێك دەمارەکە وریابکرێتــەوە، کارەبــای موجــەب دەچێتــە نــاو خانەکــە و، کارەبای سالبیش دەچێتە دەرەوەی خانەکــە. کارەبا بارگە ســالبەکە، بەدرێژایی دەمارەکــەدا دەڕوات و، تەوژمێکــی کارەبایی دروســتدەکات.

لەئاکامی ئــەم تەوژمــەوە ماســولکەکان و ئەندامەکانــی دیکەمان دەکەونــە کار. بەهۆی ئــەم ڕێکخســتنە کارەباییەوە ژیانمــان درێژەی هەیــە، دەڕۆیــن، دەجووڵێیــن، قســەدەکەین، کاردەکەیــن، دەبینین، دە بیستین...



# دەمارەخانەکان

دەمارەخانەیەك نزیکەی ١٠ مایکرۆن پانە. مایکرۆنێك یەکسانە بە یەك لە هەزاری میلیمەترێك. دەتوانن بەم نموونەیە بچووکی دەمارەخانەکان بهێننە پێش چاوتان: نووکی سەرەدەرزییەك جێی ٣٠٠٠٠ دەمارەخانەی تێدا دەبێتەوە. یەکێك لە گرنگترین ئەرکەکانی دەمارەخانەکان ئەوەیە ڕاگەیاندن لە دەمارەخانەکانی دیکەوە وەربگرن و بیانگوازنەوە بۆ دەمارەخانەی دیکە.



دەمارەخانە: لە ناوکێك و، ڕیشاڵی کورت، کە ڕاگەیاندنی کارەباییان هەڵگرتووە و، ڕیشاڵی درێژ، کە ڕاگەیاندنەکان دەگوازنەوە، پێکدێت.

بە ڕیشاڵە کورتەکان دەوترێت «لق و پۆپ»، و بە ڕیشاڵە درێژەکانیش دەوترێت «تەوەرە». دەمارەخانە، کە لە تاڵە دەزوویەك باریکترە، نزیکەی یەك مەتر درێژە.

دەمارەخانە، لە ماوەی یەك لە هەزاری چرکەیەکدا ڕاگەیاندنەکان دەگوازێتەوە.

## کاتێك دەرزی دەچێت بە دەستتاندا...

بیهێننە پێش چاوتان کە لەکاتی ماسی ڕاوکردندا دەرزی قولاپەکەتان بچێت بە دەستتاندا. ماوەی نێوان بریندابوونتان و هەستکردنی مێشکتان بە ئازەرەکە تەنها یەك لە هەزاری چرکەیەکە. ئەم ماوەیە هێندە کورتە کە هەرگیز ناتوانین هەستیپێبکەین. بەڵام لەم ماوەیەدا ڕاگەیاندنێك لە پەنجەتانەوە گەیشتووەتە مێشکتان. بەرپرسی ئەم گەیاندنەش دەمارەخانەکانن. دەمارەخانەکان بەخێراییەکی لەڕادەبەدەر پەیامەکان دەگەیەننە شوێنی مەبەست. بەمشێوەیەش بەر لەوەی دەرزییەکە زیانی زۆرتان پێبگەیەنێت، خێرا دەستتان دەکێشنە دواوە.

دەمارەخانەکان لـە لق و پـۆپ و تـەوەرە پێکدێن. لـق و پۆپەکان ڕاگەیاندنـەکان دەگوازنـەوە بـۆ خانەکـە. لەشـەخانە، کـە ناوەندی خانەکەیـە، کارەکانـی خانەکـە ئاڕاسـتە دەکات. دواتـر تـەوەرەکان ڕاگەیاندنـەکان دەگوازنـەوە بـۆ دەرەوەی خانەکـە.

تەوەرەکان بە تۆڕێك کۆتاییان پێدێت کە لە چەندین لقی ورد پێکهاتوون.

کاتێك ڕاگەیاندنـەکان دەگەنە کۆتایـی تەوەرەکان، بـە ناوەندێکی بچووك دەگەن کـە پێی دەوترێـت (گەیێنکە قڵێـش). گەیێنکە قڵێش دەمارەخانەکان لەیەکـدی جیادەکاتەوە.

ڕاگەیاندنـەکان، کاتێك بە گەیێنکە قڵێشـدا دەپەڕنـەوە، دەبنە هۆی دەردانـی چەنـد ماددەیەکـی کیمیایـی، کـە ڕاگەیاندنێکـی دیکە لە دەمارەخانەکـەی دواتردا دەسـتپێدەکەن.



# هەستیاری کاتی ڕاگەیاندنەکان

هەرگیز بیرتان لەوە کردووەتەوە ئەگەر دەمارەخانەکان ڕاگەیاندنەکانیان لەکاتی خۆیاندا نەگواستایەتەوە چی ڕوویدەدا؟ ئەگەر شتی وا ڕوویدات ئەوا ناتوانن ئەو کارانەی سالانێکە بەئاسانی ئەنجامیاندەدەن چی دیکە ئەنجامیانبدەن. بۆ نموونە پاش چەندین کاتژمێر لە خواردنی ئینجا تامی خواردنتان دەکرد و، پاش ماوەیەکی زۆر تێدەگەیشتن ئەو شتەی دەستتان لێداوە هێندە گەرمبووە دەستتان بسووتێنێت یاخود نا و، چەندین کاتژمێر تێدەپەڕی تا لە واتای فیلمێك دەگەیشتن. کاتێك پرسیارێکتان لێدەکرا تا لێی تێدەگەیشتن و وەڵامتان دەدایەوە چەندین خولەك تێدەپەڕی. نەتاندەتوانی زۆر کاری وەك یاریکردن لەگەڵ هاوەڵەکانتان، کۆششکردن بۆ تاقیکردنەوە، خۆ هەڵدانە مەلاوانگەوە، یاخود نان خواردن ئەنجامبدەن. جا ئەگەر چالاکییە خۆنەویستەکانی وەك لێدانی دڵ و چالاکی ئەندامە ناوەکییەکانیشمان بخەینە پاڵ ئەمانە، تێدەگەین کە خاوبوونەوەی گواستنەوەی ڕاگەیاندنەکان چ دەرئەنجامگەلێکی ترسناکی لێدەکەوتەوە.

بەڵام دەمارەخانەکان، هێندە خێرا کاردەکەن کە ڕێگە بە کەمتەرخەمییەکی لەم شێوەیە لە گواستنەوەی پەیامەکانی جەستەماندا نادەن. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش ڕێوشوێنی تایبەتی خۆیان هەیە. پەیوەندییەکی سەرسوڕهێنەر لەناو مێشك خۆیدا و لە نێوانی مێشك و ئەندامەکانی دیکەشدا دروستدەکەن.

کاتێك ئێوە بەبێ گوێپێدان جووڵەیەکی سادە دەکەن، ئاڵوگۆڕکردنێکی زۆر چڕوپڕی زانیاری دەکەوێتە نێوان دەمارەخانەکانتانەوە. بۆ نموونە کاتێك ئێوە چاو بە لاپەڕکانی ئەم کتێبەدا دەخشێنن، دەمارەخانەکانتان زۆر وشیارانە ڕاگەیاندنەکانی پەیوەست بەم چالاکییەتانەوە دەگوازنەوە بۆ مێشکتان.



لە هەمــوو ئاژەڵانــدا تایبەتمەندییەکانی وەك جــوڵان و، خواردن و، بەرهەمهێنــان هەیە. لە مرۆڤدا، لــە پاڵ ئەمانەشــا تواناکانی وەك «بیر، هــۆش و، ژیری»یش هــەن. بە گشــت ئەندامــە گەڕخەرەکانی هەموو ئــەم تایبەتمەندییانە دەوترێــت «دەمارە کۆئەندام». دەمــارە کۆئەندام لە دەمــاخ و دڕکەپەتك و دەمــارەکان پێکدێت.

دەمارە کۆئەنـدام، پێشـکەوتووترین و گرنگترین ئامـڕازی پەیوەندیـی جەسـتەی مرۆڤـە. ئـەم کۆئەندامـە، ئـەو زانیارییانـەی لـە دەرەوەڕا وەریاندەگرێـت دەیانگەیەنێت بـە ئەندام و شـانە و خانە پەیوەسـتەکان.

دەمارە کۆئەندام

1 ناوەندە کۆئەندامی دەمار
مێشك, مێشکۆڵە, دڕکەپەتك, قەدی دەماخ

2 چێوە کۆئەندامی دەمار
لەشە دەمارە کۆئەندام خۆییە کۆئەندامی دەمار

دەمــارە کۆئەنــدام دابــەش دەبێت بۆ دوو بەشــەوە کــە ئەوانیش، «ناوەنــدە کۆئەندامــی دەمار» و «چێــوە کۆئەندامــی دەمار»ن.

• مێشــك و دڕکەپەتــك، کــە ناوەنــدی بنەڕەتــی کۆنتڕۆڵکردنــی جەســتەن، ناوەنــدە کۆئەندامــی دەمــاری پێکدەهێنــن. ناوەنــدە کۆئەندامــی دەماری، پێکهاتەیەکــی ئاڵۆزە کە ناوەندەکانــی بڕیاردان،

لێکدانــەوەی زانیارییە وەرگیــراوەکان لە دەوروبەرەوە، تێگەیشــتن و، تــەواوی چالاکییــە ژیرییەکانــی لەخۆگرتووە.

• ملیارەها دەمارەخانـەش، کە زۆرینەیـان یەکهاتوونەتـەوە و، بوونەتە گـورزە، چێـوە کۆئەندامـی دەمـار پێکدەهێنـن. لـە کێبڵـە دەمارییـەکان پێکدێـت، کـە تـەواوی زانیارییـە هەستییەکان (وەك تـام و، بینیـن و، بەرکەوتـن و، بیسـتن و، بـاری لـەش و، ئـازار و، گەرمـی و لـەرە و، هتـد...) دەگەیەنـن بـە ناوەنـدە کۆئەندامـی دەمـار و، فەرمانەکانـی ناوەندیـش دەگەیەنن بە شـوێنە پەیوەندیدارەکانی وەك ماسولکە و لیکـە ڕژێنەکان.

> دەتوانین کۆئەندامی دەماری بە تۆڕی کارەبا بچوێنین. هەر پچڕانێك لە هەر شوێنێکی تۆڕەکەدا هەبێت، واتە هەر زیانێك بەر دەمارەکان بکەوێت، بە مانای وەرنەگرتنی وریاکەرەوەکان و، دەرنەکردنی فەرمان دێت.




مێشك
تەنی كاڵۆسەم
قەدی مێشك
مێشكۆڵە
چاو
فرمێسك ڕژێنەكان
لینجە پەڕەی لووت و مەڵاشوو
لیكە ڕژێن
ژێرزمانە ڕژێن
لینجە پەڕەی ناودەم
لیكە ڕژێنەكانی بن گوێ
كلۆرە خوێنهێنەرەكان
شاخوێنبەر
دڵ
قورقوڕاگە
قوڕگ
بۆری هەوا
بۆریچكەی هەوا
سی
سورێنچك
گەدە
لوولەی خوێن
جگەر
زراو
پەنكریاس
ئەدرینالە ڕژێن
ڕیخۆڵە باریكە
ڕیخۆڵە ئەستوورە
گورچیلە
میزڵدان

# دەماخ

دەمـــاخ، گرنگتریـــن ئەندامی ناوەنـــدە کۆئەندامی دەمارییـــە. لەناو کەللـــەی ســـەردایە و لە دەرەوە بە ســـێ پـــەردە داپۆشراوە.

تەواوی کارەکانی جەســـتەمان لەلایەن دەماخەوە ئاڕاســـتەدەکرێن. لەهەمان کاتیشـــدا فرمانەکانی وەك بیرکردنەوە و، یادگە و، هەســـتەکان و، قســـەکردنیش هەر دەماخ لێیان بەرپرســـە.

کێشـــی دەماخی کەسێکی پێگەیشـــتوو نزیکەی ١,٤ کیلۆگرام دەبێت. دەماخ ١٠٠ ملیـــار دەمارەخانەی تێدایە.

ئـــەو لوولە خوێنانـــەی خۆراکی دەمـــاخ دابیندەکـــەن، کاتێك دەچنە نێو شـــانەی دەماخەوە گۆڕانکارییـــەك بەســـەر پێکهاتەکەیاندا دێت و، پێکهاتەیەکـــی تایبەتیان دەبێت کـــە ڕێگە نادەن بـــە تێپەڕبوونی هیچ ماددەیەك بەنێـــو دیوارەکانیاندا. بـــەم هۆیەوە دەماخ، کـــە ئەندامێکی زۆر هەســـتیارە، لە هێرشـــی ماددە زیانبەخش و نەخوازراوەکانی خوێن پارێزراوە.



هەرڕەفتارێك، سادەبێت یان ئاڵۆز، بەچالاکی کۆمەڵێك دەمارەخانەی بەشە جیاوازەکانی دەماخ دێتە ئاراوە. بۆ ئەوەی دەماخ بتوانێت چالاك بێت، ئەوا پێویستە پەیوەندی لە نێوان دەمارەخانەکاندا هەبێت. ئەم پەیوەندییەش لەڕێی ڕاگەیاندنە کارەباییەکانەوە دەستەبەر دەکرێت.

- نزیکەی ١٠٠ ملیار دەمارەخانە لە جەستەماندا هەیە.
- خانەکانی دەماخ نزیکەی ٢٥٪ی وزەی جەستە بەکاردەهێنن.
- هەر مرۆڤێك دەماخی دەربهێنرێت ژیانێکی بێئاگایی دەژی.
- لای چەپی جەستەمان لەلایەن لای ڕاستی مێشکمانەوە ڕێکدەخرێت و، لای ڕاستی جەستەشمان لەلایەن لای چەپی مێشکمانەوە ڕێکدەخرێت.




**ژێر لانك**، دەكەوێتە بنكی مێشـــكەوە و، هێندەی دەنكــە بەزالیایـــەك دەبێت. پلەی گەرمـــی جەســـتە ڕێكدەخـــات. لەهەمـــان كاتیشـــدا چالاكییەكانی ژێرمێشكە ڕژێنیش كۆنترۆڵ دەكات. لە ڕێكخستنی هەستەكان و، برسێتی و، تینوێتییشـــدا ڕۆڵ دەبینێت.

لـــە دەماخـــدا ســـێ بـــەش بەناوەكانی قەدی دەماخ و، مێشـــكۆڵە و، مێشـــك هەن.

**قەدی دەمـــاخ**، وەك پردێكە كە مێشـــك و دڕكەپەتـــك بەیەك دەگەیەنێـــت. هەندێ چالاكی جەستە وەك هەناسەدان، پەستانی خوێن، خێرایی دڵ و، هەرســـكردن كۆنترۆڵ دەكات.




**مێشـــكۆڵە**، دەكەوێتـــە پشـــت قـــەدی دەماخـــەوە و لـــە دوو نیوەگـــۆ پێكدێـــت. بەرپرســـیارە لـــە هاوســـەنگی و جوڵـــەی ماســـولكەكان.

**مێشـــك**، بەرپرسە لە بەشـــێكی گەورەی چالاكییەكانـــی تێگەیشـــتن و بیركردنەوە. مێشـــك گەورەتریـــن بەشـــی دەماخـــە و بەشـــی دەرەوەی پێـــی دەوترێـــت توێكڵی مێشـــك، كە ڕەنگی خۆڵەمێشـــییە و بەشی نـــاوەوەی ڕەنگی ســـپییە.

**نیوەگۆی ڕاست و چەپی مێشکمان هەریەك بەرپرسیارن لە چەند چالاکییەکی جیا لە یەکدی.**

نیوەگۆی چەپ: چالاکییەکانی قسەکردن و، خوێندنەوە و نووسین و، ژمارەزانینی لە ئەستۆیە. لە کردارە وردەکاندا ڕۆڵدەبینێت.

نیوەگۆی ڕاست: بەهرەکانی پەیوەست بە مۆسیقا و هونەرە جوانەکان، داهێنانی بیر و، لێکدانەوەی شێوە ئەندازەییەکان لە پسپۆڕییەکانی ئەم بەشەن. بارودۆخە پەیوەندیدارەکان بە هەست و نەستەوە زیاتر پەیوەستن بە نیوەگۆی چەپەوە نەك نیوەگۆی ڕاست.

**درکە پەتك،** پێکهاتەیەکە لە ناو بڕبڕەکانی پشتدایە. بەدرێژایی تەمەن لەناو بڕبڕەی پشتدا درێژدەبێت.

بەشێوەیەکی گشتی درکە پەتك لە ناوەڕاستدا باریکە و، لە سەرەوە بۆ خوارەوە جۆگەیەك لە ناوەندیدا هەیە و، وەك لوولەیەك وایە. جۆگەکەی ناوەڕاست بە شلەی درکەپەتك پڕکراوەتەوە. ماددەی خۆڵەمێشی دەوری جۆگەکەش لەشی دەمارەخانەکانی تێدایە.

درکەپەتك ناوەندی بەرپەرچدانەوەیە. ئەو ڕاگەیاندنانەی دەچن بۆ مێشك و لە مێشکەوە دەردەچن دەگوازێتەوە. پەیوەندی لەنێوان بەشێکی گەورەی جەستە و مێشکدا دەستەبەردەکات.

**شلەی درکەپەتك،** لە پێکهاتەکانی خوێن پێکهاتووە و، ڕەنگیی کاڵی هەیە و، لە کاتی زەبردا ڕۆڵی کوشن دەبینێت و مێشك دەپارێزێت. جگە لەوەش جێگۆڕکێی خۆراك و پاشەڕۆکان لەنێوان مێشك و خوێندا بەئەستۆی ئەم شلەیە.

# خوێن

خوێـــن، یەکێکە لـــە گرنگترین مـــاددەکان بـــۆ درێژەپێدانـــی ژیانی مـــرۆڤ. بنەڕەتترین ئەرکـــی خوێن ئەوەیـــە بگاتە تـــەواوی خانەکانی جەســـتە و ئۆکســـجینیان بۆ دابینبکات. جەســـتەمان بۆ هاوســـەنگی پلەی گەرمیـــی قـــەرزداری خوێنە.

خانەکانمـــان بـــۆ ئـــەوەی بتوانـــن شـــەکر بســـووتێنن و وزەی لـــێ بەرهەمبهێنن ئۆکســـجینیان پێویســـت دەبێـــت. خوێن بە تـــەواوی لە جەســـتەماندا دەگەڕێت بەبێ جێهێشتنی تاکە شـــوێنێك. ئەگەر خوێن لە گەڕانیـــدا شـــوێنێك بپەڕێنێت و، ئەو شـــوێنە بێ ئۆکســـجین بێت، واتە ئەو شـــوێنە بـــەرەو مـــەرگ دەچێت.



# پێویستی جەستە بە خوێن

پێویســتە لە جەستەی کەســێکی پێگەیشــتووی تەندروستدا ٥ لیتر خوێن هەبێــت. ئەگەر بەهــەر هۆکارێك بێت خوێنبەربــوون ڕوویدات و، بەشــێکی ئەم خوێنە، بــۆ نموونە لیترێك خوێن لەدەســتبچێت، ئەوا ســووڕاندنەوەی ئــەو خوێنەی دەمێنێتــەوە بەنێو جەســتەدا کارێکی گــران دەبێــت. خوێنەکە ئیــدی لوولەکانی پــێ پڕناکرێت. لــە ئاکامی ئەمــەدا موولوولەکانــی خوێــن پێکدا دەلکێــن، ئیدی ســووڕی خوێن دەوەســتێت و خانە بــێ ئۆکســجینەکانیش وردەوردە دەمرن. خانەکان تەنهــا دەتوانن یــەك دوو خولــەك بەرگەی بێ ئۆکســجینی بگرن.



# ئەو ئەندامەی سووڕانی خوێن

## دادەبینەکات دڵە!

خوێـــن، بەهـــۆی دڵەوەیـــە کـــە دەتوانێت بگاتـــە هەمـــوو جێیەکی جەســـتە. لای چەپـــی دڵ خوێنی پاك بەرەو جەســـتە بەڕێـــدەکات. لای ڕاســـتیش، بـــۆ پاککردنـــەوەی خوێنی بەکارهاتـــوو لە دوانەئۆکســـیدی کاربۆن، بـــەرەو ســـییەکانی دەنێرێت.

دڵ لـــە خولەکێکدا نزیکـــەی ٧٠ جار و، لە ڕۆژێکدا نزیکـــەی ١٠٠،٠٠٠ جار و، لە ســـاڵێکدا نزیکەی ٣٧ ملیـــۆن جار و، بە درێژایـــی تەمەنی مرۆڤیش نزیکەی زیاتر لـــە دوو ملیار لێدەدات.

ئێوە خەریکـــی هەر کارێك بـــن، دڵ لـــە لێدانی خـــۆی ناکەوێت. دڵ لە ماســـولکەگەلێکی هێنـــدە تایبەت دروســـتکراوە، کە ئەم ماســـولکانە هەرگیز ماندووبـــوون نازانن.




خوێنی پیس — خوێنی پاك

# ترومپا و زمانەکان

دڵ لە دوو سیستمی ترومپای سەروو و خوارووو پێکدێت. بە ترومپا بچووکەکانی دڵ دەوترێن گوێچکەڵە و، بە ترومپا گەورەکانیش دەوترێن سکۆڵە. کاتێك خوێنی پاك سەرەتا دەگاتە لای چەپی دڵ، گوێچکەڵەکەی سەرەوە پڕ دەکات. لێرەوەش دەنێردرێت بۆ ترومپا گەورەکەی خوارەوە. ترومپا گەورەکەش خوێنەکە بۆ ئەندامەکانی جەستە دەنێرێت.

هەمان چالاکی لە ترومپاکانی لای ڕاستی دڵیشدا دووبارە دەبنەوە. لە نێوان ئەم ترومپایانەدا زمانەی یەك ئاڕاستە هەن. ئەم زمانانە بە ئاڕاستەی تەوژمی خوێندا دەکرێنەوە. هەماهەنگییەکی زۆر ناوازە لە نێوان ترومپا و زمانەکاندا هەیە.



# سیستمی کارەبایی دڵ

دڵی مرۆڤ، کە بەگشــتی ٧٠ ســاڵ دەژی، شــەو و ڕۆژ، بێ وەســتان، چەندین ســاڵ لێدەدات. کارکردنی دڵ پەیوەســتە بە وزەی کارەباوە. دڵ، خوێــن و تەواوی ماددە پێویســتەکان بۆ هەموو ئەندامەکانی جەســتە دەنێرێت.

دڵ، هەمــوو ئــەو ئەرکــە گرنگانــەی بەهــۆی وزەی کارەبــاوە جێبەجێدەکات. لەبەر ئەمەشە کاتێك کەســێك لێدانی دڵی تێکدەچێت پزیشــکەکان بەپەلــە تــەزووی کارەبای لێــدەدەن.

ئەو وزەیــەی بۆ لێدانی دڵ پێویســتە، لــە دەرەوەی دڵــەوە نایەت. بەڵکو دڵ خۆی وزەی پێویســتی خۆی بەرهەمدەهێنێــت. کارەبا دەبێتە هۆی گرژبوونی ماســولکەکانی دڵ.



# پێویستیی ماسولکەکان بە کارەبا

بۆ ڕۆیشـــتن و، ڕاکردن و، خوێندنەوە و ئەنجامدانی چەندین چالاکی دیکەش پێویســـتیمان بـــە بڕێـــك وزەی دیاریکراوە. ئـــەوەی ئەم وزەیە دابینـــدەکات و لەکاتی پێویســـتیدا دەیخاتە گەڕ بۆمان ماســـولکەکانن. سیســـتمی جووڵەکردنمان لە ماســـولکەکان پێکدێت. لە جەســـتەتاندا هێندە ماســـولکەی گەورە و بچووك هەیە کە بـــە تێکڕایی نزیکەی ٤٥٪ی کێشی جەســـتەتان پێکدەهێنن.

گرنگتریـــن تایبەتمەنـــدی ماســـولکەکان توانای گرژبوونیانـــە. ئەگەر توانـــای گرژبوونـــی ماســـولکەکانتان زیادبـــکات، ئـــەوکات ئێـــوەش توانـــای کارکردنـــی زیاترتان دەبێـــت. لەبیرتان نەچێت بەهۆی ماســـولکەکانتانەوە دەتوانن بنووســـن، بخوێننـــەوە، لە وانەی وەرزشـــدا ڕابکـــەن، یاخـــود لەگـــەڵ هاوەڵێکتانـــدا قسەبکەن. بچووکترین کێشـــە لە کۆئەندامی ماســـولکەکاندا دەشـــێت ببێتە هۆی تێکچوونی تـــەواوی چالاکییەکانـــی ژیانتان.



# کاتێک دەرگایەک دەکەنەوە لە جەستەتاندا چی ڕوودەدات؟

کاتێک دەمانەوێت پەنجەیەکمان یاخود دەستێکمان بجوولێنین، دەمارەخانە بێهەژمارەکانی مێشک دەستدەکەن بە ناردنی ڕاگەیاندن بۆ یەکتری. یەکەم شوێن کە ڕاگەیاندنەکەی پێدەگات دڕکەپەتکە. لێرەوە بەرەو قۆڵ دەڕوات. کاتێک ڕاگەیاندنە کارەباییەکان دەگەنە قۆڵتان ماسولکە ڕیشاڵەکانتان دەکەونە جووڵە. ماسولکەی قۆڵتان گرژدەبێت و قۆڵتان دەنووشتێتەوە. بەمشێوەیەش ئێمە دەتوانین زۆر بەئاسانی دەسکی دەرگاکە بکەینەوە.

هەرچەندە ئەم ڕووداوانە زۆر درێژخایەن دەردەکەون، بەڵام لەڕاستیدا تەنها یەک لە هەزاری چرکەیەکیان پێدەچێت. ئەمەش وادەکات کە بتوانن هەر لەگەڵ بڕیارداندا دەرگاکە بکەنەوە.



بۆ ئــەوەی ماســولکەکانتان بتوانن بەشــێوەیەکی ڕاســت کاربکەن، سیســتمێکی پەیوەندی لــە جەســتەتاندا کارایــە. بۆ ئــەوەی بتوانن جووڵەیەك بکەن پێویســتە تەواوی ئەو ئەندامانــەی پەیوەندییان بەو جووڵەیەوە هەیە لــە بارودۆخەکــە ئاگاداربکرێنەوە. ئــەو ئەندامانەی ئــەم زانیارییانــە دەنێــرن چــاوەکان و، ماســولکەکان و، جومگــەکان و، پێســتتانن. بەمشــێوەیە تــەواوی ئەندامــە پەیوەندیــدارەکان بەو جووڵەیــەوە ئــاگاداری یەکــتری دەبن و هەریەکە ئەرکی ســەرشــانی خــۆی بەجێدەگەیەنێت.



# کۆنترۆڵ بەدەستی مێشکمانە!

بەوپەڕی ئاسـانییەوە دەتوانـن وردەکاری ڕووداوەکانی دەوروبەرتان ببینـن. دەتوانـن لەهەمان کاتـدا گوێتان لـە جریوەی چۆلەکـەکان و، دەنگی باران و، قسـەکانی دایکیشـتان بێت. دەتوانن بەدەم قسـەکردن لەگـەڵ هاوڕێکەتانـەوە بیر لـە پرسـیارەکانی بەردەمتـان بکەنەوە و وەڵامیـان بدەنەوە و، لەهەمان کاتیشـدا بە قاچتان ئـاوازی گۆرانییەك لێبدەن. لە گەرمـادا ئارەقدەکەنەوە، لە سـەرمادا هەڵدەلەرزن و، هەرگیز بۆنـی گوڵێکتان بیرناچێتـەوە، کە لە منداڵیـدا بۆنتانکردووە.

ناوەنـدی کۆنترۆڵکردنی هەمـوو ئەم چالاکییانە، کـە ژیانی ئێوەیان پێکهێنـاوە، مێشـکە. هەر شـتێك لـە جەسـتەدا ڕوودەدات مێشـك ئاڕاستەی دەکات.





ئێمـــە کاتێك خەریکی ژیان و گوزەرانی خۆمانیـــن، لەلایەکی دیکەوە، دوور لە ئاگایـــی ئێمە، چەندیـــن چالاکی لە جەســـتەماندا دەگوزەرێت. چەندەها چالاکی وەك لێدانی دڵ و، هەناسەدان و کارکردنی گورچیلەکان و کۆئەندامـــی هەرس و کۆئەندامی بەرگریـــمان و، دەردانی هۆڕمۆنەکان و، گرژبوونـــی ماســـولکەکانمان و، چەندیـــن چالاکی دیکـــەش لەلایەن مێشـــکمانەوە ڕێکدەخرێن. مێشـــك بە بەکارهێنانی سیستمی کارەبایی دەتوانێت هەموو ئـــەم چالاکیانەی ببـــات بەڕێوە. لەم ڕووەوە مێشـــك ئامرازێکـــی پەیوەندییە، کە خاوەنی پێشـــکەوتووترین تەکنەلۆجیایە لە دنیادا.



# لە ئینتەرنێت گشتگیرتر

یەکێك لە ناوازەترین شاکارە تەکنەلۆجییەکانی سەردەم سیستمی ئەنتەرنێتە. ئەنتەرنێت، بوار بۆ ملیۆنان کەس دەڕەخسێنێت کە لەڕێی کۆمپیوتەرەوە پەیوەندی لەگەڵ یەك ببەستن. ئەو پەیامانەی لە کۆمپیوتەرەکەی خۆمانەوە دەینێرین، لە ڕێی کێبڵەوە و بە یارمەتی کارەبا دەگاتە کۆمپیوتەری کەسی بەرامبەر. بەمشێوە دەتوانن لە شوێنی خۆتانەوە سەدەها زانیاری لەیەك کاتدا دەستبخەن.

بەڵام مێشکمان سیستمێکی زۆر لە ئەنتەرنێت ئاڵۆزتری هەیە. مێشك زیاتر لە ١٠٠ ملیار دەمارەخانە، وەك ئەو کۆمپیوتەرانەی بەردەوام بە ئەنتەرنێتەوە پەیوەستن بەکاردەهێنێت. ئەو پەیامانەی لەلایەن دەمارەخانەکانەوە دەگوازرێنەوە گشتیان لە مێشکدا کۆدەکرێنەوە. لە هەر چرکەیەکدا تریلیۆنان ڕاگەیاندنی کارەبایی بە خێرایی ٤٠٠ کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا لەنێوان دەمارەخانەکاندا دێن و دەچن. بەم هۆیەوە مێشك تەکنەلۆجیایەکی هێندە پێشکەوتووە کە لەگەڵ هیچ سیستمێکی پەیوەندیدا بەراورد ناکرێت.

لە مێشکی تاکە کەسێکدا نزیکەی ١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ (سەد ملیار) دەمارەخانە هەیە. ئەگەر دەمارەخانەکانی مێشك یەك یەك بنێینە پاڵ یەك، ئەوا درێژییەکەیان چەند سەد هەزار کیلۆمەترێك دەبێت.



# نهێنی ئەنجامدانی چەند کارێك لە یەك کاتدا

ئەو ١٠٠ ملیار دەمارەخانەیەی لە مێشکدا هەن وەك تۆڕێك جەستە دادەپۆشن. بەمشێوەیە، هەر پەیامێك لە هەر جێیەکی جەستەوە بێت کۆدەکرێتەوە و دەنێردرێت بۆ مێشك. مێشك، کە ئاگاداری هەموو بەشێکی جەستەیە، ڕێگە بە ڕوودانی هیچ کەمتەرخەمییەك نادات.

بە هۆی ئەمەوە دەتوانین لەیەك کاتدا چەند چالاکییەك ئەنجام بدەین.

# سیستمی کارەبا چ سوودێکی بۆ ئێوە هەیە؟

بە هۆی تۆڕی پەیوەندی نێوان دەمارەکان و مێشکتانەوە گشت هەستەوەر و ئەندامەکانتان بەشێوەیەکی تەندروست کاردەکەن.



بۆ نموونە، کاتێك لاپەڕەی کتێبێك هەڵدەدەنەوە دەتوانن لە نێوان پەنجەکانتاندا هەست بە تەنکی و نەرمی لاپەڕەکان بکەن، دەتوانن بە دەستەکەی دیکەشتان پەرداخێك شیر هەڵبگرن و قوومێکی لێ بخۆنەوە و، هەست بە گەرمیی شیرەکە بکەن و، تامیشی بکەن، لە هەمان کاتیشدا دەتوانن سەبارەت بە بەرنامەکانی کۆتایی هەفتە قسە لەگەڵ دایکتاندا بکەن. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەتوانن لە دوورەوە گوێتان لە دەنگی ئوتومبیلێك بێت، هەست بە ساردی کەشوهەوا بکەن و هەڵبلەرزن، یاخود بانگی هاوەڵێکتان بکەن. ئەگەر سەرنجبدەن لێرەدا جەستەتان لە یەك کاتدا بیردەکاتەوە، تامدەکات، هەست بە گەرمی دەکات، قسەدەکات، پەنجەکان و ماسولکەکان بەکاردەهێنێت. هەموو ئەمانە بەهۆی هاتووچۆی ڕاگەیاندنە کارەباییەکانەوە لە نێوان مێشك و ئەندامە پەیوەندیدارەکانتاندا دەستەبەر دەبێت.

**دەتوانن هەموو شتێکی دەوروبەرتان ببینن، تامی هەموو خۆراکێك بکەن، بۆنی گوڵەکان بناسنەوە، یاخود هێندەی یەك و دوو دەنگەکانی چواردەورتان لەیەکدی جیابکەنەوە. هەموو ئەمانە بەهۆی کارکردنی ناوازەی سیستمی کارەبایی جەستەتانەوە دەبێت.**



# مێشك بە كارەبا كاردەكات

كاتێك دەســت لە شــتێكەوە دەدەن، چۆن دەزانن ئەو شــتە ڕەقە، نەرمە، گەرمە، یاخود ســاردە؟ بــۆ زانینی ئەمە لە ســەری پەنجەكانتانــەوە، كە بەر ئەو شــتە كەوتوون، لەڕێی ڕاگەیاندنــی كارەباییەوە هەموو ئــەم زانیاریانە بۆ مێشــك دەنێردرێن. مێشــك ئەم پەیامە كارەباییانە هەڵدەســەنگێنێت و شــیياندەكاتەوە. بەمشێوەیە چەندین زانیاری ســەبارەت بەو شتەی دەستان بەریكەوت بەدەستدەهێنن.

بــۆ نموونــە، مژمژەیەكی گێلاس دەبەن بــۆ دەمتان. گەورەیــی مژمژەكە، تامی گێلاســەكە، شــێوە و چێژی مژمژەكە... هەموو ئــەم زانیاریانە لەلایەن مێشــكتانەوە پێتاندەگەن. تــەواوی زانیاریەكانی پەیوەســت بە مژمژەكەوە لەڕێــی ڕاگەیاندنی كارەباییەوە دەنێردرێت بۆ مێشــكتان. مێشكیشــتان ئەم ڕاگەیاندنانە هەڵدەســەنگێنێت و، بەمشــێوەیە تەواوی ئــەم زانیارییانەتان ســەبارەت بــە مژمژەكە دەســتدەكەوێت، بــەڵام ئــەم كارانە هێنــدە خێرا ڕوودەدەن، كــە لەگەڵ مژمژەكەتان بــرد بۆ دەمتان لە ماوەیەكــی زۆر كورتدا گشــت ئەم زانیارییانەتــان چنگدەكەوێت.

مێشك وزەی كارەبایی بۆ تەواوی جەستە دەنێرێت. لەهەمان كاتیشدا ئەم وزەیە بەكاردەهێنێت. ئەندامەكانی جەستەتان، تامی هەر شتێك بكەن، هەر شتێك ببینن، هەر شتێك ببیستن، یان بەر هەر شتێك بكەون لە ڕێی ڕاگەیاندنی كارەباییەوە مێشك ئاگاداردەكەنەوە، مێشك ئەم ڕاگەیاندنانە وەردەگرێت و هەڵیاندەسەنگێنێت. بەمشێوەیە دەتوانن بەشێوەیەكی تەندروست هەر پێنج هەستەكەتان پێكەوە بەكاربهێنن.




چاو وەك هەستەوەرێك كاردەكات
زانیارییەكان لەڕێگەی
پەیامی كارەبابییەوە بۆ مێشك
دەنێرێت
تەواوی پەیامە كارەبابییەكان
لە مێشكدا كۆدەكرێنەوە
و بە شوێنی پێویست
دەگەیەنرێن
مێشك و درکە پەتك
↓
ناوەندە کۆئەندامی دەمار
ئەو فەرمانانەی لە مێشكەوە دێن
دەگەیەنرێنە شوێنی مەبەسی جەستە
↓
چێوە كۆئەندامی دەمار
جەستە بەگوێرەی ئەو فەرمانەی
لە مێشكەوە وەریدەگرێت
دەكەوێتە جووڵە.

# سیستمی کارەباییتان چ شتانێکی بۆ ئێوە دەستخستووە؟

ئەگەر لــە دەســەڵاتماندا بووایە و بمانتوانیایە لەســەر شاشــەیەک هەمــوو شــوێنێکی جەســتەمان، جموجوڵــی ماســولکەکانمان، پاککردنــەوەی خوێــن لەلایــەن دڵمانــەوە، کارامانــە گواســتنەوەی پەیامــە کارەباییەکان لەلایــەن دەمارەخانەکانــەوە و، چالاکییە ئاڵۆز و بێکەموکورتییەکانــی مێشــکمان ببینین ئــەوا ڕووبــەڕووی یەکێک لە سەرســوڕهێنەرتین ســاتەکانی ژیانمــان دەبووینــەوە.

جەســتەمان بەشــێوەیەکی زۆرباش خۆی لەگەڵ کارەبای پێویستیدا گونجانــدووە. ئێمەش بەم هۆیــەوە دەبینین، دەبیســتین، بۆندەکەین، هەســتدەکەین، دەڕۆین، کاردەکەین، قســەدەکەین، یەکدی دەناسین و، بەوپەڕی ئاســوودەییەوە درێــژە بەژیانمان دەدەین.

